# هەگبەی زانیاری






٣٣٣٣ پرسیار و وەڵام

لە ٣٣ بواری جیاوازدا

ئامادە کردنی
سالار هەولێری

چاپی دووەم
٢٠١٣






ناسنامەی

ناو: هەگبەی زانیاری

بابەت: زانیاری گشتی

ئامادەکردنی: سالار هەولێری

چاپخانە: رۆژهەلات - هەولێر

چاپ: دووەم/ 2013

تیراژ: 1000/ دانە

بەرهەم: (11)






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٥٩٥ )ی ساڵی ( ٢٠٠٨ )ی پێدراوە.



07504671394

07501181919

hawler.chap@gmail.com

# هەگبەی زانیاری

## ٣٣٣٣ پرسیار و وەڵامی هەمەڕەنگ لە ٣٣ بوار دا

ئامادەکردن و دانانی:

سالار هەولێری

پێداچوونەوەی: کۆمەڵێك پسپۆڕ لە بوارەکاندا

چاپی دووەم

٢٠١٣

هەولێر

# پێشەکی

سڵاو و ڕێز و سوپاسم بۆ ئەو خوشك و برا بەڕێزانەی کە لە بەرگی یەکەم و دووەم دەستخۆشی و تێبینی بەپێز و بەسوودیان پێدام، لەڕێگەی مۆبایلەکەم هەروەها بەڕاستەوخۆش، لە هەموو شار و شارۆچکەکانی کوردستانەوە بێ جیاوازی، سوپاسی هەستی بەرزی بەڕێزیان و بەڕێزتان دەکەم خوێنەرە خۆشەویستەکان، هەرئەوە هۆیەش بوو کە بووە هاندەر و پاڵنەرم کە بەرگی سێیەمیش بخەمە بەردەستی بەڕێزتان، بۆئەوەی هەگبەیەکی گەورەتر و زیاتر لەزاست و زانیاری، لەهەموو بوارەکانی ژیان وەربگرن و بزانن و شارەزاتربن، ئەمەی ئێستاش چاپی دووەمە لە بەرگی سێیەم کە سەرەڕای چەندین جار پێداچوونەوە، بۆ ئەم چاپەش پێداچوونەوەم بۆ کردووە و هەڵە و کەموکوڕییەکانیم چاککردووە، بەڵام هێشتاش لەوانەیە هەڵەوکەموکوڕی تێدا مابێ، بەهیوام جێی ڕەزامەندیتان بێت، هێڤی خازم ڤێجارێ و ڤێبەرگێ کوو بەرگا (٣)یێیە، زۆر باشتر و پتر سوود و مفایێ ب خواندەڤانێن خۆشتڤی و ڕێزدار بگەهینم، زۆر سوپاسیا هەوە دکەم کوو هەر سەرنج و تێبینییەك هەبن دشێن من ئاگادار بکەن ب ڕێکا ڤێ ناونیشانا خارێ:

**سالار هەولێری ٢٠١٢/١٢/١٢**
Salar.hewlery@gmail.com
یان ژمارەی مۆبایل: 495 83 31

## سیفەت و تایبەتمەندییەکانی ئەم کتێبە:

* کۆکراوە و لێکدراوی بەرگی یەکەم و دووەمە و بە زیادکراوی بەرگی سێیەم، کە بەرگی یەکەم و دووەم هەر یەکەی(٥٠٠) پرسیار بوو، هەروەها بە زیادکردنی (٢٣٣٣) پرسیار و زانیاری نوێ.

* زیادکردنی بوار و بڕگەکان بۆ (٣٣) بوار.

*ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و پێداچوونەوەیەکی زۆر باشی هەمووی کراوە، لە لایەن چەندین کەسی شارەزا، بەدەگمەن هەڵەی تێدا بەدی دەکرێ.

*ڕەچاوی حەز و خواستی خوێنەر کراوە بەهەموو تەمەن و چین و توێژەکان بەوەی کە بوارەکان لەگەڵ بیرو ڕا و داب و نەریت وئایین و پیشە و کاری تایبەت بەخۆی دەگونجێ و زانست و زانیاری زیاتری پێدەبەخشێ.

* بۆهەر بوارێك (١٠١) پرسیار و وەڵام دانراوە.

* هەوڵدراوە پرسیار و زانیارییەکان بەکورت و پوخت و ڕوونی بێ و خوێنەر ماندوو و بێزار نەکات.بۆ منداڵان و تازە پێگەیشتووانیش بشێت.

*پرسیار و وەڵامەکان پاش و پێش کراون واتە بە گوێرەی بوارەکان ڕیز کراون

هەندێك پرسیار لەبەرگی یەکەم و دووەم لەبەشێك دا بووینە، بەڵام لەبەر ئەوەی چەند بەش و بڕگەی نوێ و تایبەت لەم بەرگە زیادکراوە بۆیە چووەتە بەشێکی تر، ئەمەش لە بەر ئەوەی تایبەت تر بووە بەو بەشە.

# ناوەڕۆك


| لەلاپەڕە | تا لاپەڕە | بەشی | بواری |
|---|---|---|---|
| ١٣ | ٢٢ | یەکەم | ئایینی |
| ٢٣ | ٣٤ | دووەم | ژیاننامەی پەیامبەر(د.خ) |
| ٣٥ | ٤٦ | سێیەم | خەون و لێکدانەوەی |
| ٤٧ | ٥٦ | چوارەم | قورئانی پیرۆز |
| ٥٧ | ٦٦ | پێنجەم | مێژوویی |
| ٦٧ | ٧٤ | شەشەم | مێژووی ڕاگەیاندن |
| ٧٥ | ٨٢ | حەوتەم | زمانی ڕەسمی وڵاتان |
| ٨٣ | ٩٠ | هەشتەم | مەتەڵەکان |
| ٩١ | ٩٨ | نۆیەم | کۆدەکانی پەیوەندی کردن |
| ٩٩ | ١٠٨ | دەیەم | تەندروستی |
| ١٠٩ | ١١٨ | یازدەیەم | وەرزشی |
| ١١٩ | ١٢٨ | دوازدەیەم | تۆپی پێ |
| ١٢٩ | ١٣٦ | سێزدەیەم | جوگراف |
| ١٣٧ | ١٤٤ | چواردەهەم | ناوی وڵات و پایتەختەکانی جیهان |
| ١٤٥ | ١٥٢ | پانزەهەم | ئابووری و دراوی وڵاتان |
| ١٥٣ | ١٦٢ | شانزەهەم | گەردونزانی و فەلەکناسی |
| ١٦٣ | ١٧٠ | حەڤدەیەم | یەکە و پێوانەکان |
| ١٧١ | ١٨٠ | هەژدەیەم | ئاژەڵ و گیانداران |

| لەلاپەڕە | تا لاپەڕە | بەشی | بواری |
|---|---|---|---|
| ١٨١ | ١٩٠ | نۆزدەیەم | باڵدار و پەلەوەران |
| ١٩١ | ٢٠٠ | بیستەم | داهێنان و داهێنەران |
| ٢٠١ | ٢٠٨ | بیست و یەکەم | پەندی پێشینان |
| ٢٠٩ | ٢٢٠ | بیست و دووەم | وتەی ناوداران |
| ٢٢١ | ٢٣٠ | بیست و سێیەم | ناو و ناسناوەکان |
| ٢٣١ | ٢٤٠ | بیست و چوارەم | کوردستانی |
| ٢٤١ | ٢٤٨ | بیست و پێنجەم | فەرهەنگی کوردی |
| ٢٤٩ | ٢٥٦ | بیست و شەشەم | زاراوە و ماناکانی |
| ٢٥٧ | ٢٦٦ | بیست و حەوتەم | پەرتووك و نووسەران |
| ٢٦٧ | ٢٧٤ | بیست وهەشتەم | کیمیا |
| ٢٧٥ | ٢٨٨ | بیست و نۆیەم | یاسا و هێماکانی هاتووچۆ |
| ٢٨٩ | ٢٩٨ | سییەم | ئەدەبی |
| ٢٩٩ | ٣٠٨ | سی و یەکەم | هونەری |
| ٣٠٩ | ٣٢٠ | سی و دووەم | ئینتەرنیت و کۆمپیوتەرزانی |
| ٣٢١ | ٣٣٠ | سی و سێیەم | هەمەڕەنگ |

# سوپاس بۆ ...

***ئەو بەڕێزانەی خوارەوە کە یارمەتییان دام و پێداچوونەوەیان بۆکردم، پاش پێداچوونەوەکەش هەریەکەی لە بوار و پسپۆڕی خۆی و بە کورتی ڕاو بۆچوونیان بۆ نووسیوم:***

**١- ( مامۆستا .دلاوەر شێخ محمد هەرکی )بەمشێوەیە ڕاو سەرنجی خۆی دەربڕیوە:**

﴿لەبەرئەوەی ژیان هۆڵی تاقیکردنەوەیە، لەم هۆڵەدا ئادەمیزاد هەمیشە ڕووبەڕووی پرسیارگەلێك دەبێتەوە، بۆیە بەهۆی وەڵامی ڕاست و دروست دەتوانین لەم هۆڵەدا بەئاسوودەیی بژین، بێگومان لە دایکبوون و هاتنە ئامێزی پەرتووکی(هەگبەی زانیاری)بەشی سێیەم بەهەردوو باڵی پێشووتر کە بەرگی یەکەم و دووەمیشی تیادا کۆکراونەتەوە ئەوەمان پێدەڵێ کە زانست و زانیاری لە هەر کون و قوژبنێك بێت بە پێی تواناو سنووری هێز و وزەی خۆی، هەوڵدەدات شارەزامان بکات لە گشت بوارەکانی ژیان، بۆیە دەڵێم گەر هیچ پرسیار و وەڵامێکت لە هزردا نییە، فەرموو لە (٣٣)بواردا (٣٣٣٣)پرسیار و وەڵام بزانە و بە هۆیانەوە باڵبگرە و بفڕە لە ئاسمانی زانست و زانیاریدا، پەی بە خۆشترین شوێن و فێنکترین هەناسە و بۆندارترین بۆن هەڵمژە و دڵ و دەروون و خەیاڵت ئاسوودە بکە، لە وەرگرتنی ئەم زانست و زانیارییانەدا، دەستخۆشی لە کاکە سالار دەکەم هیوای سەرکەوتنی هیوامە﴾

٢-كاك( هۆشیار نوری لەك ) بەمشێوەیە ڕای خۆی دەر بڕیوە:

﴿دەستخۆشی لە كاك سالار دەكەم، كە هەوڵدەدات زانیاری گشتی كۆبكاتەوە، لە لایەن خۆمەوە ئەم كارەی بەگشتی و بەشی پەندی پێشینان و مەتەڵ بەتایبەتی بەچاك و باش هەڵدەسەنگێنم، بە هیوای باشتریش، ئایندەی گەشە ئەم لاوە خوێن گەرمە، پێی دەڵێم خەرمان بەرەكەت﴾

٣-د. حەیدەر عەزیز بەمشێوەیە ڕای خۆی دەربڕیوە:

﴿دەستخۆشی لە كاك سالار دەكەم بۆ ئەم كارە چاكەی كە ئەنجامی داوە، بە كۆكردنەوەی زانیاری گشتی، كارێكی زۆر باشە و لە جێگەی خۆیەتی، چونكە زانیاری گشتی بۆ هەموو كەسێك پێویستە، كە شارەزایی لێی هەبێ، وەك دەڵێن: (هەر چەند بزانی و فێربیت، ئینجا دەزانی كە هیچ نازانی) بە هیوام بەرهەمی زیاتر و باشتری بەدوا دابێت﴾

٤-كاك ( سالار جەلال ) بەمشێوەیە ڕا و سەرنجی خۆی دەربڕیوە:

﴿ئەو كارەی كاك(سالار هەولێری)كردوویەتی كارێكی جوان و چاكە، جێگەی دڵخۆشی و دەستخۆشی لێكردنە، هیوای سەركەوتن و پێشكەوتنی زیاتری بۆ دەخوازم، كۆكردنەوەی زانست و زانیاری گشتی لەلایەن هەر كەسێكەوە، بۆ خودی خۆی دەوروبەری كارێكی باش و پێویستە، پێویستە هەموو لایەكمان بزانین بۆ ئەوەی بژین، ئەگەر زۆر بزانین زۆر خۆشبەختانەش دەژین﴾

٥-كاك( سوهەیب جەمیل عەلی ) بەمشێوەیە ڕای خۆی دەربڕیوە:

﴿دەستەكانت خۆش و هیوای سەركەوتنی زێتر و زیاترت بۆ دەخوازم، ئەوەی بە ئەنجامت گەیاندووە، مشتێكە لە خەرمانێك، كارێكی بەرز و

پیرۆزە و کۆکردنەوەی زانیارییەکانی نێو ئەم پەرتووکە ئەوە دەسەلمێنن کە ماندووبوون و شەونخوونی زۆرت کێشاوە، مایەی خۆشحاڵییە کە توانیووتە پرسیار و وەڵامی گرنگ و بایەخدار هەڵبژێری بۆ سوودمەندبوونی خوێنەران، جارێکی تر دەستخۆشیت لێدەکەم و دەستی ماندووبوونت دەگوشم﴿

٦- م. زێوەر ئەنوەر بەمشێوەیە ڕای خۆی دەربڕیوە:

﴾ئەو کەسەی یەك پیتم فێربکات کۆیلەی ئەوم و مامۆستامە، دەستخۆشی لێ دەکەم ڕێز لە شەونخوونی و ماندووبوونی دەگرم، بە بایەخ و بە نرخی زێڕ و گەوهەر و مرواری هەڵدەسەنگێنم هیوادارم بەردەوام بێت لە نووسین کۆڵنەدات، ڕۆحت پاکە، جەستەت چالاکە، دڵ و دەروونت ڕووناکە، بۆیە بەرهەمت چاکە، کاکە وای لێهاتووە مرۆڤ لە هەموو بوارێ بزانێ. ئەوەی لەبەردەستتە، پڕیەتی لەوەی پێویستە، لەزانیاری هەمەچەشن و دەربارەی ڕۆشنبیری و هونەر و زانستە﴿

٧- هونەرمەند( ئەیاد محەمەد )بەمشێوە ڕا و سەرنجی خۆی دەربڕیوە:

﴾ڕاوبۆچوونم بەرامبەر ئەو هەموو زانست و زانیارییە گشتییە بە گشتی و بەشە هونەرییەکەی بەتایبەتی ئەوەیە: کەجێگای دەستخۆشی و ئافەرینە لە کاکە(سالار هەولێری)هیواخوازم هەموو گەنجێك وەك ئەو بە دوای زانست و زانیاری کۆکردنەوە دابن لە هەموو بوارەکانی ژیان، دووبارە دەستخۆش﴿

پ١/کەشتییەکەی حەزرەتی نوح لە کوێ گیرسایەوە..؟ (**چیای جوودی کوردستانی تورکیا**).

پ٢/ پاش ڕۆیشتنی پەیامبەر موسا(سەلامی خوای لێ بێ)کێ نەوەی ئیسرائیلی گومڕا کرد...؟ (**سامری**).

پ٣/کام هاوەڵ شاری دیمەشقی ڕزگارکرد...؟ (**خالیدی کوڕی وەلید**).

پ٤/ ناوی ئەو پەیامبەرە چی بوو کە مرد دوای ماوەیەك ئینجا زانرا؟...(**حەزرەتی سولیمان**).

پ٥/ ئایا بەهەشتییەکان بە چەند ساڵی دەچنە بەهەشتەوە...؟ (**٣٣**).

پ٦/ ئەو ئافرەتە موسڵمانە کێ بوو، کەتەمەنی گەیشتە سەد ساڵ، نە بیروهۆشی لە دەستدا نە ددانی کەوت...؟ (**ئەسمائی کچی ئەبوبەکر**).

پ٧/ئایا زانای فەیلەسوف(إبن خلدون)خەڵکی کام وڵاتی عەرەبی بوو..؟ (**تونس**).

پ٨/ ساڵی(٩)ی کۆچی بەچی ناسراوە؟ (**ساڵی نوێنەران**)

پ٩/ پەیامبەر(یونس)بۆ کام نەتەوە ڕەوانەکراوە؟ (**گەلی نەینەوا**)

پ١٠/بۆ وتراوە(مات إمام وولد إمام) واتە: (پێشەوایەك کۆچی دوایی کرد و پێشەوایەك لەدایك بوو)ئایا مەبەست لەم دوو پێشەوایە کێ و کێیە...؟ (**حەنەفی و شافیعی. ر.خ**).

پ١١/ (عبدالمطلب)ی باپیری پێغەمبەر (د.خ)چەند کوڕی هەبوو ..؟ (**١٠کوڕ**).

پ١٢/هاوەڵ(ئەبوعوبەیدە)کوێی فەتح کرد؟ (**خۆراسان**)

پ١٣/ قووڵایی خەندەقەکەی شەڕی(خەندەق)چەند بوو؟ (**٥مەتر**)

پ١٤/ ئایا مامۆستای بانگخواز شەهید(ناصر سوبحانی)لە کوێ شەهید کرا...؟ (**سنە**).

پ١٥/ ئەو هاوەڵەی خاوەنی سێ کۆچە ناوی چی یە...؟ (**أبوموسای أشعری**).

پ١٦/(بەرنابا)جۆرێکە لە جۆرەکانی چی....؟ (**ئینجیل**)

پ١٧/ خوای گەورە کامە پەیامبەری لە ناو ئاگر پاراست ..؟ (**ئیبراهیم**).

پ١٨/ کام زانای ناوداری ئیسلامی لە زیندان کۆچی دوایی کرد...؟ (**ئیبن تەیمیە**).

پ١٩/ مانای وشەی (ئیمان) چی یە ..؟ (**بەڕاست زانین**)

پ٢٠/خوای گەورە سوێند بەتەمەنی کام پەیامبەر دەخوات....؟ (**محمد**).

پ٢١/موعجیزەی پیغەمبەر(سالح)چی بوو...؟ (**هاتنە دەرەوەی وشتر لە ناو بەرد**)

پ٢٢/یەکەم کەس کێ بوو خەڵکی بۆ نوێژی تەراویح کۆکردەوە؟(**عومەری کوڕی خەتاب**).

پ٢٣/ یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد چی بوو ؟(**پێنووس**).

پ٢٤/ ئەو کۆمەڵە کەسە کێن کە خوای گەورە پێش هەموو کۆمەڵێک بانگیان دەکات بۆ بەهەشت.. ؟ (**سوپاسکاران**).

پ٢٥/ کێ یەکەم کەس بوو پۆستی دانا لە ئیسلامدا ..؟ ( **معاویە کوڕی ئەبو سوفیان**).

پ٢٦/ ئاینی فارسەکان چی بوو پێش موسڵمانبوونیان.. ؟(**مەجوسی**)

پ٢٧/ لەچ ڕۆژێك قیامەت دادێت..؟(**هەینی**).

پ٢٨/ئایا کامە خێزانی پەیامبەر(د.خ)کفنی بۆ مردنی خۆی ئامادەکردبوو..؟(**زەینەبی کچی جەحش**)

پ٢٩/ کام هاوەڵ بەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ)بۆماوەی(١٥)ڕۆژ فێری زمانی(عیبری)ی یەهودیەکان بوو...؟ (**زید بن ثابت**).

پ٣٠/کامە هاوەڵ بوو کە لە غەزای (بەدر و ئوحد و یەڕموك) بەشداری کرد...؟ (**ئەبوعوبەیدەی جەڕاح**)

پ٣١/ بەڕای مێژوونووسان حەزرەتی ئیبراهیم ناوی بابوباپیرانی چیە...؟ (**ئیبراهیمی کوڕی تارخ کوڕی ناحوری کوڕی شاروخ کوڕی ئەرفو کوڕی فالخی کوڕی عابری کوڕی شالخی کوڕی ئەرفخشەدی کوڕی سامی کوڕی حەزرەتی نوحە**).

پ٣٢/کامە فریشتە گەورەی فریشتەکانە ..؟(**جبریل**)

پ٣٣/ ئایا ناوی قولەتێن چەند لیترە کە بۆ غوسل دەرکردن بەکاردێ...؟ (**٢١٦ لیتر**).

پ٣٤/ یەکەم کەس کێ بوو ناونرا (ئەمیری ئیمانداران).. ؟ (**عومەری کوڕی خەتاب**).

پ٣٥/ دواهەمین وتەی خەڵکی بەهەشت چی یە ..؟ (**الحمد لله رب العالمین**).

پ٣٦/ لە چ ڕۆژێك (شەیتان) زەلیل وبێ توانایە.. ؟ (**ڕۆژی عەرەفە**).

پ٣٧/ یەکەم شەهیدی ئافرەت لە ئیسلامدا ناوی چی بوو.. ؟ (**سومەییە**).

پ٣٨/ لە کام جەنگ ئیمامی (حمزه) (ر.خ) شەهید کرا..؟(**ئوحود**).

پ٣٩/ نوێژێك لە مزگەوتی (الاقصی) بەرامبەر چەند نوێژە.. ؟(**٥٠٠ نوێژ**).

پ٤٠/ پێش ئایینی پیرۆزی ئیسلام (یثرب) ناوی کام شار بوو..؟ (**مەدینە**)

پ٤١/ نوێـــژی جـــەژنی قوربـــان و ڕەمـــەزان حوکمەکـــەی چـــییە...؟ (**سوننەتە**).

پ٤٢/ حوکمی ماچ کردنی بەردەڕەشەکە چییە...؟(**سوننەتە**).

پ٤٣/ حوکمی شاردنەوەی تەرمی مردوو بەشەو چییە....؟(**پەسەندە و ئاساییە**).

پ٤٤/ کێ بوو بانگی دا لە سەر کەعبە لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەی پیرۆز.. ؟( **بیلالی کوڕی ڕەباح**).

پ٤٥/ حوکمی نوێژی تەراویح چی یە ..؟ (**سوننەتە**).

پ٤٦/ خواردنی گۆشتی چ ئاژەڵێك دەستنوێژ دەشكێنێت...؟ (**حوشتر**)

پ٤٧/ مزگەوتی(صواف) لـە هـەولێر لەسـەر حـسابی کـێ دروسـتکراوە؟ (**محمد محمود الصواف**).

پ٤٨/(شەیتان)لە چی دروست کراوە ..؟ (**ئاگر**).

پ٤٩/- یـــەکێك لـــە خـەلیفـــەکانی عەباســـی(١٨)ســـاڵ حـــوکمی کـــرد کورتەباڵاش بوو؟(**المعتصم بالله**).

پ٥٠/ حوکمی(ئیستیمنا_هێنانەوەی مەنی بەدەست) لە لایەن زۆربـەی زانایانی موسڵمان چییە...؟(**حەرامە- مەگەر بۆخۆپاراستن لەزینابێ**).

پ٥١/ حەزرەتی(یوسف)چەند ڕۆژ لە ناو بیر مایەوە؟ (**٣ڕۆژ**).

پ٥٢/ ئەو هاوەڵە ناوی چی بوو کە شەهید کرا عەرشی پەروەردگار هاتە لەرزین..؟(**سەعدی کوڕی مەعاز**).

پ٥٣/ یەکەم نێردراو(رسول)بۆ سەرزەوی کێ بوو؟ (**نوح**).

پ٥٤/ کامە پەیامبەر دارتاش بوو.. ؟(**زەکەریا**)

پ٥٥/ مانای وشەی (ڕەمەزان) چی یە.. ؟(**زۆرگەرم**).

پ٥٦/گـــەلی(أصـــحاب الأيکـــة)قـــەوم و گـــەلی چ پەیامبـــەرێك بـــوون..؟

(**هەزرەتی شوعەیب**).

پ٥٧/ ئایا حوکمی ئەو کەسە چییە کە دەچێتە لای فاڵچی و باوەڕی پێدەکات...؟ (**٤٠ڕۆژ عیبادەتی قبوڵ نابێ، ئەگەر باوەڕی پێبکات کافر دەبێت**).

پ٥٨/ یەکەم کەس لە جیهاندا کە یادی لە دایکبوونی پەیامبەر(محمد)ی کردەوە کێ بوو...؟ (**سوڵتان موزەفەر کۆکبری**).

پ٥٩/ لە مانگی ڕەمەزان ئیمامی شافعی(ر.خ) ڕۆژانە چەند قورئانی دەخوێند..؟ (**ڕۆژێ خەتمێك**) .

پ٦٠/ بەتەمەنترین پەیامبەر کامە بوو کە لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکراوە..؟ (**هەزرەتی نوح**).

پ٦١/ چەند ساڵ جارێك ڕەمەزان دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی لە هەمان وەرز و لە هەمان ڕۆژی پێشووی خۆی..؟ (**٣٦ ساڵ جارێك**).

پ٦٢/ کێ هەڵگری ئاڵای موسڵمانەکان بوو لە شەڕی ئوحود..؟ (**سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص**).

پ٦٣/ کێ مێژووی کۆچی داهێنا..؟ (**عومەری کوڕی خەتاب**)

پ٦٤/ کێ فەرماندە بوو لە ڕزگارکردنی میسردا..؟ (**عەمری کوڕی عاص**).

پ٦٥/ (جن)ەکان لە چی دروستکراون...؟ (**هەڵمی ئاگر**).

پ٦٦/ ئەو کەسە کێ بوو کە گەورەترین پیاوی کافرانی کوشت و گەورەترین پیاوی موسڵمانانی شەهید کرد..؟ (**وەحشی کوڕی حەرب**)

پ٦٧/ ژمارەی خەلیفەکانی عەباسی چەند بوو..؟ (**٣٧ خەلیفە**)

پ٦٨/ ئەمە چ خواردنێکە پاش خواردنی نابێ بڵێی"خوایە لەوە چاکترمان بدەیتێ..؟ (**شیر**).

پ٦٩/ یەکەم کێو کە لەسەر زەوی دانرا لە کوێ بوو بەناوی چی بوو...؟ (**لەمەککە بەناوی أبی قبیس**).

پ٧٠/ کامە پەیامبەر بۆ یەکەمجار زرێ و قەڵغانی دروست کرد..؟ (**داود**).

پ٧١/ ئاگری دۆزەخ چەند ئەوەندەی ئاگری دونیا بە تینە..؟ (**٧٠ جار**).

پ٧٢/ کام پێغەمبەر(کەعبە)ی بنیاتنا؟ (**إبراهیم**).

پ٧٣/ گەلی چ پەیامبەرێك بە تاوانی نێربازی ناسرا بوون....؟ (**لوط**).

پ٧٤/کام پەیامبەر بەمنداڵی قسەی کردووە....؟ (**هەزرەتی عیسا**).

پ٧٥/ ژمارەی ئەو ولأتانە چەندە کە لەناو رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی دان؟(**٥٧ ولأت**).

پ٧٦/لە وتاری حەجیماڵئاوایی کام هاوەڵ بوو کە وتارەکەی پەیامبەری دووبارە دەکردەوە بۆ ئەوەی هەموو خەڵك گوێی لێبێ...؟ (**ڕەبیعەی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف**).

پ٧٧/ ڕەنگی بەردەڕەشەکەی (کەعبە) پێشتر چۆن بوو.؟ (**سپی**).

پ٧٨/ مزگەوتی (جەلیل خەیات) پاش (١٠)ساڵ کار کردن تێیدا، کەی تەواو بوو..؟ (**٢٠٠٧/١/٢٠**).

پ٧٩/ کام پەیامبەرمزگەوتی(أقصا)ی دروست کرد ..؟ (**یعقوب**).

پ٨٠/ دووەم ئافرەت کە موسڵمان بوو ناوی چی بوو ..؟ (**أم الفضل**).

پ٨١/ ئەم پەیامبەرە کامەیە کە خوای گەورە ناوی لێناوە کەپێش ئەو هیچ کەس ئەو ناوەی لێ نەبووە..؟ (**یەحیا**).

پ٨٢/ تەمەنی پەیامبەر(إبراهیم)چەند ساڵ بوو کە پەیامبەر(إسحاق)لەدایك بوو..؟ (**١٠٠ساڵ**).

پ٨٣/ ئیمامی عەلی(ر.خ)لە(١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی(٤٠)ی کۆچی شەهید

کرا بە دەستی کێ..؟(**عبدالرزای خوارجی**).

پ٨٤/ داود پەیامبەر و سولەیمانی کوڕی لە سەر چیای سەهیۆن لە چ شارێك نێژراون...؟ (**قودس**).

پ٨٥/ لە جەنگی (تەبوك) ژمارەی جەنگاوەرانی موسڵمانان چەند هەزار کەس بوون ..؟ (**٣٠هەزار**).

پ٨٦/شوعەیب پەیامبەر لە نزیك چ شارێك نێژراوە...؟ (**سەلت**).

پ٨٧/دەوروبەر و ناو کەعبەی پیرۆز چەند بتی تێدابوو پێش لە ناوبردنیان ..؟ (**٣٦٠بت**).

پ٨٨/کام هاوەڵ بە(وەرگێڕی قورئان)ناسراوە....؟ (**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود**).

پ٨٩/ ژمارەی پاسەوانانی دۆزەخ چەندن...؟ (**١٩فریشتە**).

پ٩٠/هۆنیارێکی عەباسی بە خواپەرستی و مەسەلە ویژدانییەکان ناوبانگی دەرکردبوو...؟ (**ئەبو عەتاهیە**).

پ٩١/هەر دوو خەلیفە(عومەری کوڕی خەتتاب)و(ئەبوبەکری سددیق)لە کوێ نێژراون...؟ (**لەنیشت پەیامبەرمان محمد(ص)**) .

پ٩٢/یەکەم پەیامبەر کامە بوو یاسای(جیهاد)ی لەپێناوی خوا جێ بەجێ کرد ..؟ (**ئیدریس**).

پ٩٣/ یەکەم ئەندازیار لە ئیسلام ناوی چییە ..؟ (**سەلمانی فارسی**).

پ٩٤/ بەپێی فەرموودەی پەیامبەرمان(ص)ژمارەی سەرجەم پەیامبەران چەندە...؟ (١٢٤٠٠٠).

پ٩٥/ئەو پیشەیەی کە هەموو پەیامبەران کردوویانە چییە...؟ (**شوانی**).

پ٩٦/ کێ سەر لە نوێ بیری (زەمزەم)ی دۆزی یەوە و هەڵیدایەوە ..؟

(**عەبدولموتەلیب**).

پ٩٧/ یەکەم مزگەوت کە لە مەدینە دروستکرا ڕووە و کوێ بوو ..؟

(**بیت المقدس**).

پ٩٨/ ئەو چوار ئاژەڵە کامانەن کە زەکاتیان لێ دەردەکرێ...؟ (**مانگا و حوشتر و مەڕ و بزن**).

پ٩٩/کامە پەیامبەر لە تەمەنی گەنجیدا سەری بڕا لە لایەن گەلەکەی...؟ (**یەحیا**).

پ١٠٠/ کام پەیامبەر بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان....؟ (**حەزرەتی عیسا**)

پ١٠١/کام پەیامبەر کرایە دووپارچە بەدەستی جوولەکەکان....؟

(**زەکەریا**).

# بەشی دووەم

## ژیاننامەی پەیامبەر(د.خ)



بسم الله الرحمن الرحيم من محمد عبد الله ورسوله
الى هرقل عظيم الروم سلام على من اتبع الهدى اما بعد
فاني ادعوك بدعاية الاسلام اسلم تسلم يؤتك الله
اجرك مرتين فان توليت فعليك اثم الاريسيين و يا اهل الكتاب
تعالوا الى كلمة سواء بيننا وبينكم الا نعبد الا الله
ولا نشرك به شيئا ولا يتخذ بعضنا بعضا اربابا من
دون الله فان تولوا فقولوا اشهدوا بانا مسلمون



نامەی پەیامبەر

**ئەم بەشە تایبەتە بە زانیاری دەربارەی ژیانی پەیامبەر( د.خ )**

پ١/لە ڕۆژی دوایی کێ یەکەم کەسە کە لە گۆڕەکەی دێتەدەرەوە..؟ **(پەیامبەرمان(د.خ)**).

پ٢/پەیامبەر(د.خ)پاش وەفاتی چەند خێزانی لە دوای خۆی بەجێهێشت..؟( **9خێزان**).

پ٣/چەند جار ناوی پەیامبەر(ص)بە وشەی (محمد)لە قورئانی پیرۆز هاتووە..؟ (**٤جار**).

پ٤/کێ خزمەتکاری پەیامبەر بوو ..؟ (**ئەنەسی کوڕی مالیك**).

پ٥/ ئایا کامە خێزانی پێغەمبەر(د.خ)بوو کفنی بۆ مردنی خۆی ئامادەکردبوو...؟ (**زەینەبی کچی جەحش**).

پ٦/کۆتا جەنگی پەیامبەر (د.خ) کامە جەنگ بوو..؟ (**تەبوك**).

پ٧/ پەیامبەر(د.خ)بەکام دوومناڵی دەگوت: (اللهم إني أحبها فأحبهما)...؟ (**ئوسامەی کوڕی زەید و حەسەنی کوڕی عەلی**).

پ٨/پەیامبەرمان(د.خ)لە ڕۆژی دوایی بۆ یەکەمجار شەفاعەتی بۆ کێ دەکات..؟ (**ئەهلی بەیت**).

پ٩/کێ یەکەم کەسە لە ڕۆژی دوایی لە دەرگای بەهەشت دەدات..؟ (**پەیامبەرمان**).

پ١٠/ژمارە مناڵەکانی فاتیمەی کچی پەیامبەر(د.خ)چەند منداڵ بوون...؟ (**٦کوڕ**).

پ١١/ئەو ئافرەتە کێ بوو کە پەیامبەر(د.خ)بەکراسی خۆی کفنی کرد..؟ (**فاطمة بنت أسد**) .

پ١٢/ناسناوەکانی پەیامبەر(د.خ) چین...؟ (**أمين-صادق-ذات**

**الكوثر**...).

پ١٣/پاش وەفاتی پەیامبەر(د.خ)لە خزم و کەسانی کێ بوو وەفاتی کرد..؟ (**فاطمە ی کضی**).

پ١٤/درێژترین گەشت لە جیهاندا چییە و خاوەنەکەی کێیە...؟ (**ئیسرا و میعراجی پەیامبەرمان.ص**).

پ١٥/ کام لەمنداڵەکانی پێغەمبەر (د.خ )لە خاتوو (خەدیجە)نەبووە..؟ (**إبراهيم**).

پ١٦/کێ زۆرترین فەرموودەی پەیامبەر(د.خ)ی گێڕاوەتەوە..؟ (**ئەبو هورەیرە**).

پ١٧/ کێ بوو بۆیەکەمجار فەرموودەکانی پەیامبەر(د.خ) کۆکردەوە...؟ (**أبو رافیعی خزمەتکاری**).

پ١٨/یەکەم جەنگی پەیامبەر(د.خ)ناوی چی بوو کەی ڕوویدا..؟ (**الأبواء ٢ی کۆچی**).

پ١٩/کێ بەردەوام لەگەڵ پەیامبەر(د.خ) دابوو..؟(**الفضل بن عباس**).

پ٢٠/کێ حەواری پەیامبەر(د.خ) بوو..؟ (**زوبەیری کوڕی عەوام**).

پ٢١/ کام هاوەڵ ماوەی (10)ساڵ خزمەتی پێغەمبەری (د.خ)کرد..؟ (**ئەنەسی کوڕی مالیك**).

پ٢٢/ پەیامبەر(د.خ) چەند منداڵی هەبوو.. ؟ (**٧منداڵ**).

پ٢٣/کێ برای شیری پەیامبەر(د.خ)بوو..؟ (**أبو سوفیانی کوڕی حارس**).

پ٢٤/خۆشترین خواردن لە لای پەیامبەر(د.خ) چی بوو..؟

(**الثريد-هاوشێوەی تەشریبی ئەمڕۆ**).

پ٢٥/یەکەم کەس کێ بوو ناوی زەمزەمی هەلگرت لە کاتی گەڕانەوەی لە حەجدا... ؟ (**پەیامبەر(د.خ)**).

پ٢٦/دوا وتەی پەیامبەر(د.خ) چی بوو...؟ (**نوێژەکانتان نوێژەکانتان لە خوا بترسن لەگەڵ ئافرەتان باش بن**).

پ٢٧/یەکەم نوێژی پەیامبەر(د.خ) هی کەی بوو کە ئەنجامی دا..؟ (**نوێژی نیوەڕۆ**).

پ٢٨/یەکەم شت کە پەیامبەر(د.خ)ئاماژەی پێکردبێ لە (وحي)سرووش چی بووە...؟ (**خەونی ڕاست**).

پ٢٩/وتاربێژی پەیامبەر(د.خ) ناوی چی بوو....؟ (**ثابت بن قيس**)

پ٣٠/ یەکەم نوێژ کە پەیامبەر(د.خ) ڕکوعی تێدا برد هی کەی بوو...؟ (**نوێژی عەسر**).

پ٣١/یەکەم لیوا کە پەیامبەر (د.خ)دایمەزراند بۆ کام هاوەڵ بوو...؟(**حمزة بن عبدالمطلب**).

پ٣٢/هۆنیاری پەیامبەر(د.خ) ناوی چی بوو...؟ (**حسان بن ثابت**)

پ٣٣/لە ڕۆژی ڕزگارکردنی(مەککە)ی پیرۆز پەیامبەر(د.خ) کلیلی کەعبەی دا بەکێ...؟ (**عوسمانی کوڕی تەلحە**).

پ٣٤/یەکەم خێزانی پەیامبەر(د.خ) کە وەفاتی کرد کامەیان بوو...؟ (**خەدیجە**.ر.خ).

پ٣٥/ پەیامبەر(د.خ) تەنها خێزانێکی لاو بوو ئەویش ناوی چی بوو....؟ (**عائیشە**.ر.خ).

پ٣٦/کچی زەینەبی کچی پەیامبەر(د.خ)ناوی چی بوو....؟(**أمامه بنت عاص**).

پ٣٧/دواهەمین خێزانی پەیامبەر ناوی چی بوو...؟ (**میمونه بنت حارث**).

پ٣٨/یەکەم خێزانی پەیامبەر(د.خ) کە لە پاشە خۆی وەفاتی کرد کێ بوو...؟ (**زینب ی کچی جحش**).

پ٣٩/ پەیامبەر(د.خ) چەند حەجی کردووە..؟ (**یەك حەج کە ئەویش حجه الوداع بوو**).

پ٤٠/تەمەنی پەیامبەر(د.خ) چەند ساڵ بوو کە وەحی(سرووش)ی بۆ هات..؟(**٤٠ساڵ**).

پ٤١/یادی لە دایکبوونی پەیامبەر(د.خ)ساڵانە لە چ بەروارێکی کۆچی ئەنجامدەدرێت...؟ (**١٢ی ربیع الأول**).

پ٤٢/کێ خۆشەویستەکەی پەیامبەرمان (د.خ) بوو هەروەها خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستەکەی بوو...؟ (**ئوسامەی کوڕی یەزید**).

پ٤٣/ پەیامبەرمان (د.خ)بەکێی وت:(بهاوێژە دایك و باوکم بە فیدات بێت)..؟ (**سەعدی کوڕی وەقاص**).

پ٤٤/کێ بوو کە کچی پەیامبەرمان (د.خ) ی هێنا و دواتر کچی کچی پەیامبەری هێنا....؟ (**عەلی کوڕی ئەبو تالیب**).

پ٤٥/ پەیامبەرمان (د.خ) لە ڕۆژی (فتح) نوێژی(فتح)ی لە کوێ کرد...؟ (**ماڵی ئوم هانی**).

پ٤٦/ پەیامبەرمان (د.خ) ناوی دووڕووەکانی لای کێ ئاشکرا دەکرد...؟ (**حوزەیفەی کوڕی یەمان**).

پ٤٧/ پەیامبەرمان (د.خ) لە نوێژێکدا هەڵەی کرد کێ بۆی ڕاست کردەوە...؟ (**ذواليدين الخرباق بن عمرو السلمي**) .

پ٤٨/ پەیامبەرمان (د.خ)کاتێك چوو بۆ (طائف)کێی لەگەڵ دابوو...؟ (**زيد بن حارثة**).

پ٤٩/کێ پێش ناردنی پەیامبەر(د.خ)باوەڕی هێناوە...؟ (**ورقە بن نوفل**).

پ٥٠/دوومنداڵی هەتیو بەشیان لە زەوی مزگەوتی پەیامبەرمان (د.خ) هەبوو کێن..؟(**سهل و سهيل**).

پ٥١/دواهەمین هاوسەری پەیامبەرمان (د.خ) کامە بوو کە کۆچی دوایی کرد...؟ (**ئوم سەلەمە**)

پ٥٢/خوشکی شیری پەیامبەرمان (د.خ) کێ بوو...؟ (**شەیما.ر.خ**).

پ٥٣/ پەیامبەرمان (د.خ) دەفەرموێت مـن کوڕی دوو سەربڕاوەکەم ئەم دوانە کێن...؟.(**إسماعیلی کوڕی إبراهیم و عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب**).

پ٥٤/کێ پێی دەگوترێ (ذات الهجرتين)...؟ (**ڕوقیەی کچی پەیامبەر**)

پ٥٥/کێ چووە سەرشانی پەیامبەرمان (د.خ) بۆ شکاندنی بتەکانی قوڕەیش...؟ (**عەلی کوڕی ئەبو تالیب**)

پ٥٦/ئەو هاوەڵە کێ بوو کە پەیامبەرمان (د.خ) پێی فەرموو (مرحبا بالراكب المهاجر)...؟ (**عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل**).

پ٥٧/ پەیامبەرمان (د.خ) یەکەم نوێژی هەینی لە کوێ کرد...؟ (**لەمەدینە لەمزگەوتی بنی سالم بنی عوف کە ئێستا ناوی(مسجد الجمعه)یە**)

پ٥٨/ئەو ئافرەتە یەهودییە کێ بوو کە پەیامبەرمان (د.خ) مارەی کرد...؟ (**صفیه بنت حیی**).

پ٥٩/ژمارەی ئەو پیاوانەی ئەنسارٍ کە بەیعەتییاندا بە پەیامبەرمان (د.خ) لە عەقەبەی یەکەم چەند بوون...؟ (**١٢پیاو**).

پ٦٠/ناوی کچەکانی پەیامبەرمان (د.خ) چی بوون...؟ (**فاطمە-روقیە-أم کلثوم-زینب**.ر.خ).

پ٦١/یەکەم کەس کێ بوو کە دوای وەفاتی پەیامبەرمان (د.خ) هاتە لای...؟ (**فاتیمەی کچی بوو**)

پ٦٢/ پەیامبەرمان (د.خ)ئەم دوعایەی بۆ کێ کردووە کە دەفەرمووێ:خوایە ئەگەر دوعای کرد لێی قبوڵ بکەی..؟ (**سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص**).

پ٦٣/کێ ناوی لە پەیامبەرمان (د.خ) ناوە محمد..؟(**عەبدولموتەلیبی باپیری**).

پ٦٤/ پەیامبەرمان (د.خ) پێش ئەوەی وەفات بکات چەند ڕۆژ نەخۆش کەوت..؟(**١٤ڕۆژ**).

پ٦٥/گەورەترین موعجیزەی پەیامبەرمان محمد(د.خ) چییە؟ (**قورئانی پیرۆز**).

پ٦٦/مانای وشەی محمد (د.خ) چییە...؟ (**سوپاسگوزار**).

پ٦٧/تەمەنی پەیامبەرمان(د.خ) چەند ساڵ بوو کە دایکی کۆچی دوایی کرد..؟ (**٦ساڵ**).

پ٦٨/یەکەم کەس کێ بوو کە سڵاوی لە پەیامبەر(د.خ) کرد بە سڵاوی ئیسلامیانە...؟(**ئەبوزەڕی غەففاری**).

پ٦٩/دایەنەکانی پەیامبەر (د.خ) کێ بوون...؟ (**ثويبة-سعدية-ذات الوهة-واشي-ذات النضول-الغيرلق-ئامينة-حليمة**).

پ٧٠/ ڕمەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**المثنا-ألمو**)

٧١پ/لە (بيعة الرضوان)دا پێغەبەر(د.خ)لە جیاتی کامە خەلیفە دەستی خۆی خستە ناودەستەکەی تری بەیعەتی دا...؟ (**عوسمانی کوڕی عەففان**).

پ٧٢/هۆنیارەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**عبدالله بن رواحه-حسان بن ثابت-كعب بن مالك**).

پ٧٣/ناوی مامەکانی پەیامبەر(د.خ) چی بوون...؟ (**زوار-أبوطالب-أبولهب-عباس-حمزة-حارث-قوصي-عيداق-زبير**).

پ٧٤/پوورەکانی پەیامبەر(د.خ)لەباوکەوە ناویان چی بوو...؟ (**سعدية-عاتيكة-بيزا-برا-أروا-أمينة**).

پ٧٥/پوورەکانی پەیامبەرمان(د.خ)لە دایکەوە ناویان چی بوو...؟ (**فاخيتة-فرليسة**).

پ٧٦/ناوی خاڵەکانی پەیامبەر(د.خ) چی بوون..؟ (**عبداليغوس-أسور-عمير**).

پ٧٧/ئەو ناووناسناوانەی پەیامبەر(د.خ) کە لە قورئاندا هاتووە

چین..؟ (**محمد-أحمد-طه-یس-بشیر-نذیر**).

پ٧٨/ناسناوەکانی پەیامبەر(د.خ) لە ناو فەرموودەکاندا کامانەن...؟ (**ماحی-حاشیر-عاقیب**).

پ٧٩/لە شەوی کۆچدا کام هاوەڵ لە شوێنی پەیامبەر(د.خ) نووست...؟ (**عەلی کوڕی ئەبو تالیب**).

پ٨٠/شمشێرەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**منسور-أسیمامە-العطف-الرسوب-القلعي-المخیزم-القزیب**).

پ٨١/کڵاوە جەنگییەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**موشیع-سەبوغ**).

پ٨٢/قەلغانەکانی پەیامبەر(د.خ)ناویان چی بوو....؟ (**الزلوق-فوتق**)

پ٨٣/تیروکەوانەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**بندا-روحا-سفرا-زورا-أسدار-کتوم**).

پ٨٤/لەکاتی سەرەمەرگی پەیامبەر(د.خ) کێ پێشنوێژی بۆ موسڵمانان کرد...؟ (**أبوبکری صدیق**).

پ٨٥/کاتێك پەیامبەر(د.خ)برایەتی خستە ناو موسڵمانان کێی هەڵبژارد بۆ برایەتی خۆی...؟ (**ئیمامی عەلی**).

پ٨٦/کۆیلەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**شقران-أبورافیع-زید بن حارثة-فوزالة-ساز-سندر-أبوکبشة-سفینة-مابور-سلمان فارسي-مهران-ریباع**).

پ٨٧/ئەسپەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**سکت-ضرب-لزاز-وارید-مرتجز-طرف-نجیب-لحیف**).

پ٨٨/گوێدرێژەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**جوزامی-یعفور**) .

پ٨٩/هێسترەکانی پەیامبەر(د.خ) ناویان چی بوو...؟ (**دولدول-فیززە-ئیلیە**).

پ٩٠/سەرجەمی ژمارەی مەڕ و بزنەکانی پەیامبەر(د.خ) چەند بوو...؟ (**١٠٠مەڕ و ٧بزن**).

پ٩١/وشترەکانی پەیامبەر(د.خ)ناویان چی بوو...؟ (**إتلال-إتراف-بروده-حناو-زمزم-سعدیە-سقیا**).

پ٩٢/ پەیامبەر(د.خ)کە چووە سەرتەرمی(جلیبیب)چی فەرموو...؟ (**هذا مني وأنا منه**).

پ٩٣/موعجیزەکانی پەیامبەر(د.خ) چی بوون...؟ (**قورئانی پیرۆز-ئیسرا و میعراج-لەتبوونی مانگ**).

پ٩٤/یەکەم منداڵی پەیامبەر(د.خ) کە لە دایك بوو ناوی چی بوو...؟ (**زەینەب**.ر.خ).

پ٩٥/خزمایەتی نێوان پەیامبەر(د.خ) لەگەڵ (عبدالله ی کوڕی جحش)چی بوو...؟ (**عبدالله پوورزای بوو**).

پ٩٦/حوکمی یادکردنەوەی لەدایکبوونی پەیامبەر(د.خ)چییە...؟ (**بیدعة الحسنة-نەوباوی باش**).

پ٩٧/ کام خێزانی پێغەمبەر (د.خ)لەیەکەم ساڵی شووکردنی وەفاتی کرد ..؟ (**زەینەبی کچی خوزەیمە**).

پ٩٨/ پەیامبەر(د.خ) لە ماڵی کێ برایەتی خستە نێوان

(انصار)و(مهاجیر)...؟ (**ئەنەسی کوڕی مالیك**).

پ٩٩/چەند مامی پەیامبەر(د.خ) باوەڕییان پێی هێنا..؟(**دوو-حەمزە و عەبباس**.ر.خ)

پ١٠٠/ پەیامبەر(د.خ) بەکێی فەرموو خوایە دەوڵەتی پەرت پەرت بکەی)..؟ (**کیسرای شای فارس**).

پ١٠١/ناوی باو و باپیرانی پەیامبەر(د.خ) تاچەند پشت دەتوانی بژمێری...؟(**موحەمەد کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی قوسەی کوڕی کیلابی کوڕی مەڕڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لونەی کوڕی غالیبی کوڕی فەهری کوڕی مالیکی کوڕی ضري کوڕی کنانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مەدرەکی کوڕی ئیلیاسی کوڕی مضري کوڕی نزاری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنانە، عەدنانیش دەگەڕێتەوە سەر ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم ، سەلامی خوا لە هەموویان بێت**.

# بەشی سێیەم

# خەون و لێکدانەوەی





ئەم بەشە تایبەتە بە زانیاری دەربارەی خەون و لێکدانەوەی

پ١/بینینی (دەست بەزنجیربوون)لە خەوندا چییە...؟ (**دەستدرێژی کردنە سەرماڵی خەڵکییە**).

پ٢/بینینی(زێڕ)لە خەوندا بۆ پیاو و ئافرەت چۆنە...؟ (**بۆ پیاو خراپە بۆ ئافرەت باشە**).

پ٣/بینینی(دز)لە خەودا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**بەهەموو شێوەیەك خراپە**).

پ٤/ تۆبە و پەشیمانی مانای چی دەگەیەنیت لە خەوندا؟ (**دەوڵەمەندی**).

پ٥/ بینینی خەو بە(حج)وە چۆنە؟ (**بەهەموو شێوەیەك باشە**)

پ٦/بینینی(پێوەدانی زەنگەسوورە) لە خەوندا چۆنە؟ (**دوژمنت زیانت پێدەگەیەنێت**).

پ٧/ بینینی(سەربازی) لە خەوندا چۆنە...؟ (**هەواڵ و مزگێنییەکی خۆشە**).

پ٨/ بینینی (سەرمابوون و لەرزین)لە خەودا چۆنە...؟ (**ڕەنج و زیان پێگەیشتنە**).

پ٩/بینینی(سووتان) لە خەودا چۆنە...؟ (**دوژمنێکی سەرسەختە**)

پ١٠/بینینی(سی-سیپەلاك)لە خەودا چۆنە...؟ (**بەهەموو شێوەیەك باشە**).

پ١١/بینینی(کاڵەك-گندۆرە)لە خەودا چۆنە...؟ (**نەخۆشی و ناخۆشییە**).

پ١٢/بینینی(کەر=گوێدرێژ) لە خەودا چۆنە...؟ ( **(گەورەیی و بەختەوەرییە)**.

پ١٣/بینینی(پێڵاو)لە خەودا چۆنە...؟ **(ژنهێنانە)**.

پ١٤/بینینی کراسی دڕاو لە خەودا چۆنە...؟ **(دەوڵەمەندییە)**.

پ١٥/بینینی(کلیل)لە خەودا چۆنە..؟ **(سەرکەوتنە بەسەر دوژمنان)**.

پ١٦/بینینی (خواردنی گۆشتی مار) لە خەودا چۆنە..؟ **(خواردنی ماڵی دوژمنە)**.

پ١٧/بینینی(خواردنی ماستی شیرین)لە خەودا چۆنە..؟ **(خواردنی ماڵی حەلاڵە)**.

پ١٨/بینینی(خۆشووشتن)لە خەوندا چۆنە...؟ **(خۆشی و ڕزگار بوونە)**.

پ١٩/بنینی(خۆت لە ناو لانك) لە خەوندا چۆنە؟ **(لە ترس و ئازار دووردەبی)**.

پ٢٠/بینینی(خۆت بەلاوازی) لە خەوندا چۆنە....؟ **(کەموکوڕی ماڵە)**.

پ٢١/بینینی (لێدان و ئازاردان)لە خەوندا بەهەر شێوەیەك بێت، لێکدانەوەی چۆنە..؟**(پەسەند نییە و خراپە)**.

پ٢٢/بینینی(لیمۆ)لە خەوندا چۆنە...؟ **(نەخۆشییە)**.

پ٢٣/ بینینی(کوشتنی مار) لە خەوندا چۆنە لێکدانەوەی..؟ ( **زیان و بەلات لێ دووردەکەویتەوە)**.

پ٢٤/ بینینی(خواردنی ماستی ترش)لە خەوندا چۆنە...؟ (**خەم و خەفەتە**).

پ٢٥/بینینی(مافوور و ڕاخەر)لە خەوندا چۆنە...؟ ( **تەمەن درێژی و ڕۆژی زۆربوونە**).

پ٢٥/بینینی(پێوەدانی مار)لە خەوندا چۆنە...؟ (**زەرەر و زیانت پێدەگات**).

پ٢٦/بینینی(مەڵحەم-هەتوان لە برین دان)چۆنە..؟(**ئیمانداری و خواپەرستییە**).

پ٢٧/بینینی(پێوەدانی مار)لە خەودا، بەلاَم ئازارت پێنەگات چۆنە؟(**سەرکەوتنە بەسەردوژمنان**).

پ٢٨/بینینی (مردن) لە خەوندا چۆنە..؟. (**ئیمان لاوازییە**)

پ٢٩/بینینی(بچووك بوونەوە و منداڵ بوونەوە) لە خەوندا چۆنە..؟ (**خەم و خەفەت و کاروبار تێکچوونە**).

پ٣٠/بینینی (مێش)لە خەودا چۆنە..؟ (**بە هەموو شێوەیەك و بەگشتی خراپە**).

پ٣١/بینینی(نەخۆشکەوتن)لە خەودا چۆنە...؟ (**نیشانەی ئیمان لاوازییە**).

پ٣٢/بینینی (نینۆك) لە خەوندا نیشانەی چییە... ؟(**بەهێزی و بەتوانابییە**).

پ٣٣/بینینی(هەلآمەت-پەسیو) لە خەودا چەند گران و زۆر بێت ئەوەندەش چ دەبێت...؟ (**ئەوەندەش تووشی ناخۆشی و خەم دەبێت**).

پ٣٤/بینینی(کوژرانت) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە..؟ (**تەمەن درێژییە**).

پ٣٥/بینینی(خواردنی کولەکە=کودی)لەخەودا چۆنە...؟ (**گەیشتن بە ئامانجەکانە**).

پ٣٦/بینینی(کێشان بەتەرازوو) لەخەودا چۆنە...؟(**دادوەری نێوان خەڵکە**).

پ٣٧/بینینی(گا) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە..؟(**دەوڵەمەندی و پلە و پایەیە**).

پ٣٨/بینینی(گەسك-گێسك)بەهەموو شێوەیەك و بەگشتی لە خەوندا چۆنە..؟ (**خراپە و پەسەند نییە**).

پ٣٩/بینینی(گریان) لە خەودا لێکدانەوەی چۆنە... ؟(**خۆشی و شادومانییە**).

پ٤٠/بینینی(گۆڕستان) لە خەودا چۆنە...؟ (**هاوڕێیەتی کردنی هاوڕێی خراپە**).

پ٤١/بینینی(گوژالك)لە خەودا چۆنە..؟ (**دەوڵەمەندی و ساماندارییە**).

پ٤٢/گولاّو و بۆن لە خۆدان لە خەودا چۆنە...؟ (**سوود گەیاندنە بە خەڵك**).

پ٤٣/بینینی(بوون بە مامۆستا)لە خەوندا چۆنە...؟ (**پلە و پایە و پیرۆزییە**) .

پ٤٤/ بینینی(مەلەوانی و مەلەکردن) لە خەوندا چۆنە...؟ (**فێڵبازی و زیان گەیاندن بەخەڵکە**).

پ٤٥/ بینینی(خواردنی ماسی) لە خەوندا چۆنە...؟ (**نیشانەی بەلاّ و خەمە**).

پ٤٦/ بینینی(مەیموون) لە خەوندا چۆنە...؟ (**تووشبوونە بە دوژمنێکی فێڵباز**) .

پ٤٧/ بینینی(مراوی)لە خەوندا بەهەر شێوەیەك و بە شێوەیەکی گشتی چۆنە...؟(**باشە و پەسەندە**).

پ٤٨/ بینینی(موو هەلّوەران و نەمانی لەسەر)لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**ماڵی دەخوریَ و دەبردریَ**).

پ٤٩/ بینینی(مێشی هەنگ-مێشەنگوین) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**گەیشتنی هەوالَ و مزگێنی خۆشە**).

پ٥٠/ بینینی(مێوژ)بەهەر شێوەیەك و بەشێوەیەکی گشتی لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**باشە و چاکە**).

پ٥١/(نانکردن)لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟(**گوزەرانی خراپە**).

پ٥٢/ بینینی(دوعا و پاڕانەوە) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(پێکهاتنی پێویستییەکان و دڵپاکییە)**.

پ٥٣/ بینینی(نۆک خواردن) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(ناخۆشی و خەمە)**.

پ٥٤/ بینینی(کوشتنی ورچ) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا)**.

پ٥٥/ بینینی(ئاسنگەری کردن کە پیشەی خۆت نەبێ) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(دوژمنایەتییە)**.

پ٥٦/ بینینی(ئاشتی و دڵخۆشی) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(تەمەن درێژی و هێزە)**.

پ٥٧/ بینینی(ئاوی باران) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(هەرزانییە)**.

پ٥٨/ بینینی(بزنی سپی) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(خێر و چاکەیە)**.

پ٥٩/ بینینی(خواپەرستی و عیبادەت) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(تەنها لە مزگەوت چاکەیە)**.

پ٦٠/ بینینی(پەشیمانی و تەوبە کردن) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ **(خوای گەورە ماڵ و منداڵی پێدەبەخشێت)**.

پ٦١/ بینینی(گەدە ژان کردن و هەبوونی ئازار) لە خەوندا

لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**تەمەن کورتییە**).

پ٦٢/ بینینی(ئاگر بارین لە ئاسمان) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**زۆر خراپە**).

پ٦٣/ بینینی(ئاگری پەرش و بلاو) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**عەشقی نوێ و سەرکەوتنە**).

پ٦٤/ بینینی(پاك كردنەوەی ماڵ) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**هاتنی میوان و شاد بوون بە دیداری دۆستانە**).

پ٦٥/ بینینی(ئاوێنە-نەینۆك) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**پلە و پایەیە**).

پ٦٦/ بینینی(خواردنی پاقلە) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**ناخۆشییە**).

پ٦٧/ بینینی(قیامەت و هەڵسانەوە بۆ ڕۆژی دوایی) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**بەرپابوونی دادوەرییە لە وڵاتدا**).

پ٦٨/ بینینی(بزنی ڕەش) لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە...؟ (**خەم و ناخۆشییەکی سەختە**).

پ٦٩/بینینی(کۆتری زۆر لە ماڵدا)لە خەوندا چۆنە..؟(**زۆربوونی ماڵ و منداڵە**).

پ٧٠/بینینی(گۆڕهەڵکەندن) لە خەوندا چۆنە...؟ (**تووشی ناخۆشی و خەم بوونە**).

پ٧١/بینینی (لۆکە-پەمۆ) لە خەوندا چۆنە...؟ (**بەهەموو شێوەیەك باشە و پەسەندە**).

پ٧٢/بینینی(هەڵپەڕین)لە خەوندا چۆنە...؟ (**خراپە و ناڕەواییە**)

پ٧٣/بینینی(کێڵاَن)لە خەوندا چۆنە...؟ (**بەهرە و پیت و پیرۆزییە**).

پ٧٤/ بینینی(ترێ)لە خەوندا چۆنە؟ (**حەسوودی و چاوچنۆکیە**).

پ٧٥/ بینینی(خێرکردن)لەخەوندا بەهەموو شێوەیەك چۆنە؟ (**بەشێوەیەکی گشتی زۆرباشە و خۆشیە**).

پ٧٦/بینینی(تاڵانکردنی ماڵت)لەخەوندا چۆنە؟ (**خەم و خەفەتە**).

پ٧٧/بینینی(خاچ)لەخەوندا بەشێوەیەکی گشتی چۆنە؟ (**خەم و خراپەیە**).

پ٧٨/بینینی(خوری)لەخەوندا بەشێوەیەکی گشتی چۆنە؟(**سوود و کەڵکی زۆرە**).

پ٧٩/بینینی(جەژن)لەخەوندا چۆنە؟ (**بەهەمووشێوەیەك باشە و خۆشییە**).

پ٨٠/ بینینی(تریاك بەهەموو شیوەیەك)لەخەوندا چۆنە؟ (**خراپە و پەسەند نییە**).

پ٨١/ بینینی(خواردنی ترێ)لەخەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**نارەزووی پەرستییە**).

پ٨٢/ بینینی(ئەسپەناخ و خواردنی)چۆنە؟ (**خەم و زەرەرکردنە**)

پ٨٣/بینینی(ئێسك)لەخەوندا چۆنە؟ (**بەهەموو شێوەیەك باشە و سوودبەخشە**).

پ٨٤/ بینینی(باڵندەیەکی زۆر و جووکەیان)لەخەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**کارەساتێکی ناخۆشە**).

پ٨٥/ بینینی(درۆ)لەخەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**زیانی بۆ خۆت و ئیمانت هەیە**).

پ٨٦/بینینی(داو)لەخەوندا چۆنە؟ (**فرتوفێڵە**).

پ٨٧/ بینینی(پەنجەوانە)ی دەست لەخەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**باشە و هێز و توانایە**).

پ٨٨/ بینینی(دەرگەوانی)لەخەوندا چۆنە؟ (**پێکهاتن و گەیشتن بە ئاواتەکانە**).

پ٨٩/بینینی(دووپشك)لەخەوندا چۆنە؟ (**دوژمنێکی بێ هێزە**).

پ٩٠/بینینی(سماق)لە خەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**توووند و تیژییە**).

پ٩١/ بینینی(ترس)لەخەوندا لێکدانەوەی چۆنە؟ (**هێمنی و ئارامییە**).

پ٩٢/بینینی خواردنی سیر لە خەوندا چۆنە..؟ (**خواردنی ماڵی حەرام و ناڕەوایە**).

پ٩٣/ بینینی(خواردنی سێو)لە خەوندا چۆنە...؟ (**خەم و نیگەرانییە**).

پ٩٤/بینینی(شکانی شوێنێکی لەش)لە خەوندا چۆنە...؟ (**لەلایەن**

**خزمان ئازارت پێدەگات).**

پ٩٥/بینینی(كوشتنی دووپشك)لەخەوندا چۆنە؟ (**سەركەوتنە بەسەر دوژمناندا**).

پ٩٦/بینینی(زەنگوڵە)لەخەوندا چۆنە...؟ (**شەڕ و دوژمنایەتییە**).

پ٩٧/ بینینی(ڕاوكردن)لە خەوندا بەشێوەیەكی گشتی چۆنە؟ (**باشە و سوودبەخشە**).

پ٩٨/ بینینی(پیسایی و پاشماوەی ئاژەڵان)بەگشتی لەخەوندا لێكدانەوەی چۆنە؟ (**سەروەت و سامان و بەهرەیە**).

پ٩٩/ بینینی(دووكەڵ)لەخەوندا چۆنە؟ (**كێشە و بەڵایە**).

پ١٠٠/ بینینی(زەیتون)لە خەوندا چۆنە...؟ (**خراپە و زیانە**).

پ١٠١/ بینینی(سەرپەرشتیاری)لەخەوندا لێكدانەوەی چۆنە؟ (**خێر و چاكەیە**).

# بەشی چوارەم

# قورئانی پیرۆز



**ئەم بەشە تایبەتە بە زانیاری دەربارەی قورئانی پیرۆز**

پ١/سورەتی (حشر) لەبارەی کێ دابەزیوە...؟ (**بني نضير**).

پ٢/کێ بوو بۆ یەکەم جار قورئانی پیرۆزی بەئاشکرا خوێندەوە...؟ (**عبداللەی کوڕی مسعود**).

پ٣/خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز چەند جار باسی خۆر(الشمس)ی کردووە...؟(**٣٣جار**).

پ٤/کۆتا سورەت کامە بوو لە سورەتە درێژەکان کە دابەزی..؟(**المائدة**).

پ٥/چەند جار وشەی (الاخرة) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ..؟(**١١٥جار**).

پ٦/لە سورەتی(الرحمن)چەندجار( فبأي ألاء ربكما تكذبان)دووبارە بۆتەوە..؟(**٣١جار**).

پ٧/ کام سورەتی قورئانی پیرۆز بەناوی دوو پەیامبەر کۆتایی هاتووە ..؟ (**الاعلى**).

پ٨/چەند جار وشەی(الجنة)واتە بەهەشت لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە..؟(**٦٦جار**).

پ٩/چەند جار وشەی(النار)لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ..؟( **١٢٦ جار**)

پ١٠/کورتترین سورەت لە قورئان دا کامەیە ..؟(**الكوثر**).

پ١١/ درێژترین سورەت لە قورئان دا کامە سورەتە..؟(**البقرة**).

پ١٢/چەند جار (بسم الله الرحمن الرحيم) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ..؟(**١١٤ جار**).

پ١٣/ ئەو سورەتە کامەیە کە دوو سوجدەی تێدایە..؟(**الحج**).

پ١٤/ئایـەتی(کورسـی)دەکەوێتـە کـام سـورەت و ئایـەتی چـەند...؟ **(البقرة ٢٥٥)**.

پ١٥/نـاوی دوو ڕۆژ لـە ڕۆژەکـانی هەفتـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا هاتووە.؟**(شەممە و هەینی)**.

پ١٦/وشەی(الصمد) چەند جار لە قورئانی پیرۆزدا هـاتووە..؟ **(یەك جار)**.

پ١٧/کامـە سـورەت بـوو کـە بـووە هـۆی موسـڵمانبوونی ئیمـامی عومەر(ر.خ)..؟ **(طه)**.

پ١٨/ناوی چ ولاَتێك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ..؟ **(میسر)**.

پ١٩/ئەو سورەتە کامەیەکە بـە سـورەتی (القتـال)یـش نـاودەبرێ ..؟ **(محمد)**.

.پ٢٠/کام سورەت مرۆڤ لە فیتنەی (دەجال)دەپارێزێ ..؟ **(الكهف)**.

پ٢١/کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز بە بیرۆکـە و پێـشنیاری کـێ بـوو.؟ **(عمری کوڕی خەتاب)**.

پ٢٢/وشەی (ماء) چەند جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە..؟ (٦٣).

پ٢٣/زەیـدی کـوڕی حاریـسە (ڕ.خ) هـاوەڵێکی پەیامبـەرە (د.خ) بـوو ناوی لە چ سورەتێك دا هاتووە..؟ **(الاحزاب ئایەتی٣٧)**.

پ٢٤/وشـەی (القـرأن)چـەند جـار لـە قورئـانی پـیرۆز دا هـاتووە...؟ **(٦٨جار)**.

پ٢٥/هەر یەکە لە وشەی(الدنیا) و (الأخرة) چەند جـار لـە قورئـانی پیرۆز دا هاتوون...؟ **(هەریەکەی١١٥جار)**.

پ٢٥/ چەند جار وشەی(رمضان)لەقورئانی پیرۆز داهاتووە؟ (**١جار**).

پ٣٦/ لەکام سورەتی قورئانی پیرۆز لە هەموو ئایەتەکان وشەی(الله)ی تێدایە؟ (**المجادله**).

پ٢٧/ کام سورەت کەوتۆتە ناوەڕاستی قورئانی پیرۆز..؟ (**الكهف**).

پ٢٨/(رب اشرح لی صدری ویسر لی أمری)ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە و نزای کام پەیامبەرە...؟ (**موسا**).

پ٢٩/ خۆشەویسترین ئایەت لای پەیامبەر(د.خ)چی بوو..؟ (**إنا فتحنا لك فتحا مبينا**).

پ٣٠/هەر یەکە لە وشەی(الحیاه) و (الموت) چەند جار لە قورئانی پیرۆز داهاتووینە...؟ (**هەریەکەی١٤٥جار**).

پ٣١/ئەو پێنج سورەتە کامانەن کە لە قورئاندا بە(الحمدلله)دەستپێدەکەن...؟ (**الفاتحة**، **الأنعام**، **الكهف**، **فاطر**، **سبأ**).

پ٣٢/ئەو گیانلەبەرانە کامانەن کە ناویان لە قورئاندا هاتووە..؟ (**مێشوولە**، **مێشهەنگ**، **مێروولە**، **پەپووسلێمان**، **قەلەرەش**، **شەمشەمە کوێرە**، **پەرەسێلکە**، **کوللە-کلو**، **بۆق**).

پ٣٣/کامە سورەتی قورئانی پیرۆز لە پاش سولحی حودەیبییە دابەزی...؟ (**الفتح**).

پ٣٤/کام سورەتی قورئانی پیرۆز لە حەجیماڵئاوایی دابەزی؟ (**النصر**).

پ٣٥/ هەموو سورەتەکان خوا لەگەڵ بەندەکانی دەدوێ تەنها یەك سورەت نەبێ، کە بەندەکان لەگەڵ خوا دەدوێن ئەو سورەتە

کامەیە...؟ (**فاتیحە**).

پ٣٦/ئایا یەکەم ئایەت کامەبوو کە مۆڵەتی جیهادکردنی دا بە موسڵمانان...؟ (**ئایەتی٣٩سورەتی الحج**).

پ٣٧/لە چ ئایەت و سورەتێك بە درێژی باسی(ئەنصار)و(موهاجیر)هاتووە...؟ (**ئایەتی٣٧تا١١٧ی سورەتی التوبە**).

پ٣٨/چەند جار وشەی پیرۆزی(الله)لە قورئاندا هاتووە..؟ (١٦٩٧).

پ٣٩/ کامە پەیامبەر لە هەمووان زیاتر ناوی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە...؟ (**موسا**).

پ٤٠/ کام سورەت بەدڵی قورئان ناسراوە؟ (**یاسین**).

پ٤١/ کام سورەت بەدرێژی باسی بابەتی میرات دەکات؟ (**النساء**).

پ٤٢/دوا سورەت لە مەدینە دابەزی کامە سورەت بوو..؟ (**التوبە**).

پ٤٣/ وشەی پیاو و ئافرەت (الرجال و النساء )هەریەکەی چەند جار لە قورئاندا هاتوون؟ (**هەریەکەی٢٤**).

پ٤٤/هەر یەکەی لە وشەی(الصالحات) و (السیئات) چەند جار لە قورئانی پیرۆز دا هاتووینە...؟ (**هەریەکەی١٦٧جار**).

پ٤٥/ سورەتی (النساء ) چەند ئایەتە...؟ (١٧٦).

پ٤٦/ هەر یەکە لە وشەی (الشیطان) و (الملائکة) چەند جار لە قورئان دا هاتوون...؟ (**هەر یەکە٨٨جار**).

پ٤٧/ قورئانی پیرۆز چەند سورەتە....؟ (١١٤).

پ٤٨/ ئایەتی(السیف)واتە: (شمشێر)کامەیە؟ (**٢٩ی سورەتی تەوبە**).

پ٤٩/ کۆتا سورەتی قورئان کامە سورەتە؟ **(الناس)**.

پ٥٠/هەر یەکە لە وشەی(الضیق) و (الطمأنمینة) چەند جار لە قورئاندا هاتووینە...؟(١٣).

پ٥١/وشەی(صلاة)واتە نوێژ چەند جار لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە؟ (٩٩).

پ٥٢/ وشەی (ظالین و هادي) هەریەکەی چەند جار لەقورئاندا هاتوون؟ **(هەریەکەی١٨جار)**.

پ٥٣/ سورەتی فاتیحە زیاتر بە(١٠)ناوی تر ناودەبرێ چوار لەمانە چین؟ **(أم الکتاب-فاتحةالکتاب-أم القرأن-سبع المثاني)**.

پ٥٤/ ژمارەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز چەندن...؟ **(٦٢٣٦ئایەت)**.

پ٥٥/ سورەتی التوبە بەسێ ناوی تریش ناودەبرێ ئەو ناوانە چین؟ **(البراءة-السیف-الکاشفة)**.

پ٥٦/ وشەی (إبلیس)و وشەی(أعوذ بالله)هەریەکەی چەند جار لە قورئاندا هاتوون؟ **(هەریەکی١١جار)**.

پ٥٧/کام سورەتی قورئانی پیرۆز بەناوی ئافرەتێك ناونراوە؟ **(مریم)**.

پ٥٨/ چەند سورەت لە قورئاندا بە (یا أیها)دەست پێدەکەن...؟ (١٠).

پ٥٩/ سورەتی(کهف)چەند ئایەتە...؟ (١١٠).

پ٦٠/ گەورەترین ژمارەی بەکارهاتوو لە قورئانی پیرۆز چەندە؟ (١٠٠**هەزار) لە سورەتی صافات١٤٧**.

پ٦١/ سورەتی(عبس)لەبارەی کێ دابەزیوە؟ **(عبدالله ی کوڕی أم**

**مكتوم**).

پ٦٢/چەند پەیامبەر ناویان لە قورئاندا هاتووە...؟ (**٢٥**).

پ٦٣/ئـەم دوو ئایەتـە کامانـەن کـە لـە قورئانـدا بـە پێـچەوانەشەوە دەخوێنرێنەوە....؟ (**ربك فكبر**:**المدثر٣**) و (**كل في فلك** : **الأنبياء٣٣**).

پ٤٦/ئەو کتێبانەی ناویان لە قورئاندا هاتووە چین...؟ (**زبور**، **تورات**، **ئینجیل**، **صحف**، **القران**).

پ٦٥/بـە پێـی ڕادەی هێواشـی و خێـرا خوێندنـەوەی قورئـان چـەند جـۆری هەیـە...؟ (١-**ترتيـل**=**لەسـەرخۆ** ٢-**تـدوير**=**مامناوەنـد** ٣-**تحدير**-**خێرا**).

پ٦٦/ئەو مزگەوتانەی ناویان لە قورئلندا هاتووە کامانەن...؟ (**حرام**، **أقصى**، **ضرار**).

پ٦٧/یەکەم سورەت کە لە شاری مەدینە دابەزی...؟ (**البقره**).

پ٦٨/ سورەتی(ال عمران)چەند ئایەتە...؟ (٢٠٠).

پ٦٩/یەکەم کەس کە خاڵی بۆ پیتەکانی قورئان دانا کێ بوو...؟ (**أبو أسود الدولى**).

پ٧٠/ ئـەو سـورەتە کامانـەن کـە هـەموو ئایەتـەکانیان بـە پیتی(ر)کۆتایی هاتووە...؟ (**القمر**، **القدر**، **العصر**، **الكوثر**).

پ٧١/ئـەو ئایەتـە کامەیـە کـەوا هـەر(٢٨)پیتـە هیجائییـەکانی زمـانی عەرەبی تێدایە.. ؟ (**الفتح٢٩**).

پ٧٢/ئەو سێ کۆمەڵە کامانـەن کـە لـە سـەرەتای سـورەتی(البقـره)دا باسیان کراوە...؟ (**باوەڕداران**، **بێباوەڕان**، **دووڕووەکان**).

پ٧٣/کام ئایەت دەیسەلمێنێت کەوا خۆر وەستاو نییە...؟ (**يس٣٨**).

پ٧٤/کام سورەت لە پێش سورەتی فاتیحە دابەزیوە...؟ **(المدثر)**.

پ٧٥/چەند سورەت بە ناوی پەیامبەرانەوە ناونراون...؟ **(هود، یونس، یوسف، محمد، إبراهیم، نوح)**.

پ٧٦/ژمارەی سورەتەکانی جزوی (عم)چەند سورەتە...؟ **(٣٧سورەت)**

پ٧٧/ئەو سورەتە کامەیە کە هەموو ئایەتەکانی بە پیتی(س)کۆتایی دێت...؟ **(الناس)**.

پ٧٨/ئەو سورەتە کامەیە کە بەرامبەر سێیەکی قورئانە...؟ **(الإخلاص)**.

پ٧٩/جزوی (تبارك) چەند سورەتە...؟ **(١١سورەت)**.

پ٨٠/ئەو سورەت کامەیە کە بووکی قورئان ناسراوە...؟ **(الرحمن)**.

پ٨١/ئەو سورەتە کامەیە کە پەیامبەر(ص)لەبارەیەوە فەرموویەتی (پیری کردم)...؟ **(هود)**.

پ٨٢/ئەو سورەتە کامەیە کە هەموو ئایەتەکانی بە پیتی(د)کۆتایی دێت...؟ **(الإخلاص)**.

پ٨٣/ئەو سورەتانەی سەرەتاکانیان بە وشەی(قل)دەستپێدەکەن کامانەن...؟ **(الجن، الكافرون، الإخلاص، الفلق، الناس)**.

پ٨٤/کام سورەت هەموو ئایەتەکانی بە پیتی(ل)کۆتایی هاتووە...؟ **(فیل)**.

پ٨٥/ئەو فریشتانەی ناویان لە قورئاندا هاتووە...؟ **(جبریل، میکال، مالك، هارووت، مارووت)**.

پ٨٦/ئەو ئایەتە کامەیە کە لە ناو کەعبە دابەزی...؟ (**النساء٥٨**).

پ٨٧/ چەند سوڕەتی لە مەدینە دابەزی؟ (**٢٨**).

پ٨٨/ ئەو سێ سوڕەتە کامانەن کە پیغەمبەر(ص)شەوان دەیخوێند؟ (**الإخلاص، الفلق، الناس**).

پ٨٩/ سوڕەتی(البقرە)درێژترین سوڕەتە و چەند ئایەتە؟ (٢٨٦).

پ٩٠/ هەموو قورئان بە ماوەی چەند ساڵ دابەزی؟ (**٢٣ساڵ**).

پ٩١/ ژمارەی وشەکانی قورئان چەندە...؟ (**٧٧٩٣٤وشە**).

پ٩٢/ قورئان چەند سوڕەتی لە مەککە دابەزی؟ (٨٦).

پ٩٣/جزوی(قد سمع)چەند سوڕەتە...؟ (**٩سوڕەت**).

پ٩٤/کام سوڕەت دوو(بسم الله الرحمن الرحیم)ی تێدایە...؟ (**النمل**).

پ٩٥/کام سورەت خوێنەرەکەی لە سزای دۆزەخ دەپارێزێ؟ (**الملك**).

پ٩٦/ کام سورەت بخوێندرێ شەیتان نزیکی ئەوماڵە نابێتەوە؟ (**البقرە**).

پ٩٧/ کام سوڕەت لە دوای سوڕەتی فاتیحە دابەزی...؟ (**المسد**).

پ٩٨/ژمارەی پیتەکانی قورئان چەندە...؟ (٣٢٣٦٧١).

پ٩٩/ئەو سوڕەتە کامەیە کە بە ناوی میوەیەکەوە ناونراوە...؟ (**التین**).

پ١٠٠/دوائایەتی قورئان کە دابەزی...؟ (**مائدە ٣**).

پ١٠١/وشەی(کلا)لە چەند جوزئی قورئاندا هاتووە...؟ (**تەنها لە جوزئی**١٦-٣٠).

# بەشی پێنجەم

# مێژوویی









**ئەم بەشە تایبەتە بەزانیاری دەربارەی مێژووی گشتی**

پ١/ شەڕی چاڵدێران کە لە ساڵی(١٥١٤)ڕوویدا لە نێوان کێ و کێ بوو...؟ (**عوسمانییەکان و سەفەوییەکان**).

پ٢/ کەی سەدامی دکتاتۆری عێراق دەسگیرکرا...؟ (**٢٠٠٣/١٢/١٣**).

پ٣/ کام وڵات بۆ یەکەمجار چەکی موشەکی بەکارهێنا...؟ (**چین**).

پ٤/ لە چ ساڵێك دەوڵەتی فاتمییەکان لە وڵاتی مەغریب دامەزرا...؟ (**٩١٠**).

پ٥/ زانای بەناوبانگ(گراهام بێڵ)کەی تەلەفۆنی داهێنا...؟ (**١٨٧٦**).

پ٦/ کەی جەژنی ڕزگاری وڵاتی(سریلانکا)یە...؟ (**١٩٤٨**).

پ٧/ کێ دەوڵەتی(ئومەوییەکانی)دامەزراند...؟ (**موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان**).

پ٨/ کەی شاری بەغدا دروستکراوە...؟ (**٧٦٢ی زایینی**).

پ٩/ یەکەم کەس کێ بوو کە داوای کرد کە(هندستان و پاکستان)لێك جیابکرێنەوە...؟ (**محمد ئیقبال**).

پ١٠/ یەکەم سەرۆکی ئەمریکا کە بەهەڵبژاردن بووە سەرۆك کێ بوو...؟ (**جۆرج واشنتۆن**).

پ١١/ یەکەم پاشای عێراق ناوی چی بوو کە لە(١٨٩٨/٤/٢٢)هاتە سەرحوکم...؟ (**فەیسەڵی یەکەم**).

پ١٢/ کەی گۆتەنبەرگی زانای ئەڵمانی چاپخانەی داهێنا...؟ (**١٨٥٤**)

پ١٣/ کەی یادی ڕزگاری وڵاتی (کەنەدا)یە..؟ (**١٨٦٧/٧/١**).

پ١٤/ کەی(مەلای گەورە)مەلا محەمەدی کۆیی کۆچی دوایی کرد...؟ (**١٩٤٣**).

پ١٥/ بۆیەکەمجار تیمی ئاگرکوژێنەوە کەی و لەکوێ دامەزرا...؟

